## بسم الله الرحمن الرحيم

**الحمدلله رب العالمين، الصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه وسلم، أما بعد:**

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە نەخشەی جیهان بە گشتی پێش لافاوە گەورەکەی سەردەمی نــوح علیه السلام ڕێک وەکو نەخشەی ئێستا نەبووە.

بۆ نمونە مێژوونووسی گەورەی عەبباسی (ابو الحسن المسعودي) یازدە سەدە پێش ئێستا لە کتێبی (أخبار الزمان) باسی لەوە کردووە کە لەسەردەمی ئادەم(علیه السلام) دورگەی سەرەندیب(سریلانکای ئێستا) یەکپارچە بووە لەگەڵ هیندستان.

بەڵام ئێستا ئەو ناوچەیە دورگەیەکە و لەنێوان ئەوێ و هیندستان ئاو و دەریا هەیە.

کاتێک خوای گەورە پێغەمبەر ئادەمی دابەزاند بەپێی وتەی ابن الجوزي(رحمه الله) ناردیە سەرەندیب.

بۆیە زۆربەی زانا و موفەسیرەکان دەڵێن خوای گەورە ئادەمی ناردە هیندستان(چونکە ئەوکات سەرەندیب بەشێک بوو لە هیند و نەخشەی جیهان وەکو ئێستا نەبوو).

جا ناوچەکانی تریش بەهەمان جۆر نەخشەیان جیاوازبووە لەو سەردەمە.

ئایا ئەمریکا یەکپارچە بووە لەگەڵ ناوچەکانی تر؟ وە ئایا پێش تۆفان و لافاوی گەورەی نــوح علیه السلام خەڵک بە زەویەکانی ئێستای ئەمریکا گەیشتووە؟ زانیاری کەم و دەگمەنە لەو بابەتانە، ئەوەی دەتوانین بڕیاری

لەسەر بدەین ئەوەیە کە نەخشەی ئەمریکا بەو شێوازەی ئێستا هەیە لەدوای تۆفانی نــوح(علیە السلام) دروست بووە.

لەم نوسراوەدا باسی مێژووی کۆنی زەویەکانی ئەمریکا(باکوور و باشوور) دەکەین، واتە: لەدوای تۆفانی گەورە تا سەدەی نۆیەمی کۆچی(پازدەی زایینی).

مصطفی هیوا

## باسی یەکەم/ بنەچە و ڕەچەڵەکی خەڵکی کۆنی ئەمریکا:

دوای ئەوەی قەومی نــوح لەناوچوون و ژیانێکی نوێ دەستی پێکرد لەسەر زەوی، هەموو خەڵک لە وڵاتی بابل ژیاون تا سەردەمی (فالغ)ی کوڕی (عابر)ی کوڕی (شالخ)ی کوڕی (ئەرفەخشەد)ی کوڕی (سام)ی کوڕی پێغەمبەر نــوح، دواتر بە فەرمانی فالغ کە دەسەڵاتداربوو خەڵک بە دونیادا بڵاوبوونەوە.

نەوەکانی عامورا و ماجوج کە دوو کوڕی (یافث)ی کوڕی نــوح بوون چوونە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا.

لەم کۆچە بەرفراوانە ڕێبەری نەوەکانی عامورا ناوی (نەستورتاس)ی کوڕی (عابور)ی کوڕی (مدنج)ی کوڕی (عامورا) بوو.

سەردەمی ئەم کۆچانە شەش بۆ حەوت هەزار ساڵ پێش ئێستا بووە.

دوای ئەوەی خەڵکی لە هەردوو بەرەباب (عامورا) و (ماجوج) لە ناوچەکانی باکوری ڕۆژهەڵاتی ئاسیا جێگیربوون و زۆربوون.

ئینجا بەشێک لەو خەڵکە لەڕێی زەویەکانی چوکۆتکا(ڕۆژهەڵاتی ڕووسیای ئێستا) کۆچیان کردووە بۆ زەویەکانی باکوری ڕۆژئاوای ئەمریکا(ئەلاسکای ئێستا) و لەوێشەوە بڵاوبوونەوە زەویەکانی ئەمریکا.

ئەم نەخشەیە یەکەم کۆچی خەڵک نیشان دەدا بۆ کیشوەری ئەمریکا، ئەو هێڵەی بە ڕەنگی سوور کێشراوە ئاماژەیە بۆ بڵاوبوونەوەی نەوەکانی (ماجوج) بەرەو ڕۆژهەڵاتی ئاسیا، وە هێڵە شینەکە ئاماژەیە بۆ بڵاوبوونەوەی نەوەکانی (عامورا) بەرەو باکووری ئاسیا و هێڵە پرتەقاڵیەکەش کۆچی خەڵک نیشاندەدا لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ئاسیاوە بەرەو کیشوەرەکە.

## باسی دووەم/ زمانی خەڵکی کۆنی ئەمریکا:

دوای بڵاوبوونەوەی نەوەکانی عامورا و ماجوج لە زەویەکانی ئەمریکا، بەتەواوی جیا بوونەوە لە خەڵکی ئاسیا.

چەندین مەملەکەت و خاقانیەتیان بنیاتنا لەو کیشوەرە.

وە بە تێپەڕبوونی هەزاران ساڵ زمان و کلتوریان لەیەک جیابوویەوە لەنێوان خۆیان کە وەک دەوترێ ژمارەی ئەو شێوەزارانەی لەو کێشوەرە قسەیان پێکراوە تا سەدەی شازدە نزیکەی ٥٠٠ شێوەزار بوونە لە ئەمریکای باکوور و ٦٠٠ شێوەزاریش لە ئەمریکای باشوور بەڵام دواتر زۆربەی هەرە زۆریان لەناوچوون دوای ئەوەی سوپا یەک لەدوای یەکە ئەوروپیەکان چوونە ئەو زەویانە و کەوتنە کوشتار و لەناوبردنیان لە سەدەکانی شازدە تا بیست.

یەکێک لەو زمانانەی تا ئێستا مابێتەوە زمانی (مایا)یە کە چەند ناوچە و گوندێکی دیاریکراو لە (مەکسیک) قسەی پێدەکەن.

زمانی (مایا) لە نەوەکانی (عامورا) پەیدا بووە و چەندین وشەی هاوبەشی تێدایە لەگەڵ زمانی تورکی(کە گومان لەوەدا نییە تورکی زمانێکی عامورِاییە).

بۆ نمونە لە زمانی تورکی بە ژمارە (سێ) دەوترێ (ئوچ)، وە لە زمانی مایا دەوترێ (ئوش).

یاخود وشەی (خان) کە تورک بۆ خاقانەکان بەکاریان هێناوە لەزمانی مایا دەوترێ (کان)، وە سەرۆکە کۆنەکانی مایا کە لە مەکسیکی ئێستا ژیاون ناوی (کان)یان بۆ خۆیان بەکارهێناوە، وەکو (کانی یەکەم) و (کانی

دووەم) کە ئەمیری شاری (کەرەکۆل) بوونە لەسەدەکانی شەش بۆ حەوتی زایینی.

وەک دەبینین کە لە ناوی شاری (کەرەکۆل) دەستەواژەی (کەرە) بەکار هاتووە کە زۆرجار لە زمانی تورکیش لە پێش ناوی شاران بەکاردێت، وەک: کەرەباخ کە شارێکە لە ئازەربایجان.

تەنانەت لە وڵاتی کازاخستان شارێک هەیە بەناوی (کەرەکۆل- karakol) وەکو ناوی ئەو شارەی مایا.

جا هەرچەندە زمانی مایا کە پاشماوەی زمانە لەناوچووەکانی ئەوێیە وشەی هاوبەشی هەیە لەگەڵ زمانی تورکی بەڵام لەبەر ئەوەی چەندین هەزار ساڵ لە ئاسیا دابڕابوون بۆیە زمان و شێوازی گفتوگۆیان گۆڕاوە و کاتێک گوێیان لێدەگری وا هەست ناکەی پەیوەندیەکی هەبێ بە زمانی تورکی و چەندین جیاوازی گەورەی هەیە، بۆ نمونە حاڵەتی (ڕابردوو) و (ئێستا) و (داهاتوو) لە زمانی مایا بوونی نییە، بەڵکو بەپێی شێوازی قسەکردن دەردەکەوێ کە مەبەستی چ کاتێکە.

ئەو وشانەشی خستمانەڕوو چەند نمونەیەکی وشەکاری بوون بۆ دەرخستنی پەیوەندی و بنەچەی پێک بەستراوی زمانی تورکی و زمانی مایای خەڵکی کۆنی ئەو کیشوەرە کە هەردوو زمان عاموڕایین.

## باسی سێیەم/ گەشتی (ذوالقرنین) بۆ کیشوەری ئەمریکا:

لە قورئانی پیرۆز لە سورەتی (الكهف) خوای گەورە باسی پیاوچاکێکی دەسەڵاتدار دەکا بە ناوی ذوالقرنین کە گەشتی کردووە بە دونیادا و ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای نۆڕیوە.

جا لە کتێبی (أخبار الزمان)ی مێژوونووس (أبو الحسن المسعودي) هاتووە کە حەزرەتی ذوالقرنین گەشتی کردووە بۆ دوورگەیەک(بە دوورگەیەکی زۆر گەورە وەسفی دەکات کە چەندین زەوی لەخۆ گرتبوو) و خەڵکەکەی (حەشیش)یان بەکاردەهێنا.

سەردەمی ذوالقرنین دەگەڕێتەوە بۆ ٣,٥٠٠ساڵ بۆ ٤,٠٠٠ ساڵ پێش ئێستا، لەو سەردەمەش حەشیش لە چەند ناوچەیەک هەبووە، لەوانە (چین) و (هیند) و (ئەمریکا)، هیند و چین دوورگە نین، بۆیە تاکە شوێن کە دوورگە بووبێت و حەشیشی لێ بووبێ زەویەکانی ئەمریکا بووە و ئەو وەسفەی لەو بەسەرهاتە هاتووە تەنها لەگەڵ ئەمریکا دەگونجێ.

ئەمەش دەقی بەسەرهاتی گەیشتنی ذوالقرنینە بەو دورگە فراوانە، لە کتێبی (أخبار الزمان) لاپەڕە ٦٩-٧٠:

"ذوالقرنین چووە ناو دورگەیەک و لەوێ گەیشتە هەندێک حەشیش، ئینجا گەیشتە قەومێک کە ڕۆچووبون لە خوا پەرستی(لەبەردەم تیشکی خۆر) و دەموچاویان ڕەش ببوو، لەلایان وەستا و سەلامی لێکردن، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە.

جا پێی وتن: ژیانتان چۆنە لەو وڵاتە؟

ئەوانیش وتیان: ژیانمان لەسەر ماسی دەریایە لەگەڵ بەکارهێنانی حەشیش.

ذوالقرنین وتی: ئایا نەتانگوازمەوە بۆ شوێنێکی تر کە بەرهەمی زیاتری بۆتان هەبێ؟

وتیان: چ بەرهەمێکی ترمان هەبێ؟ ئێمە لە وڵاتەکەمان دەوڵەمەندین و هەموو شتێکمان هەیە، وە ئەوەی لێرە هەیە ئەگەر بەهەمووی بگەین ئەوا بەسمانە.

ذوالقرنین وتی: چ شتێک لێرە هەیە؟

ئەوانیش (ذوالقرنین)یان برد بۆ ناوچەیەکی خۆیان کە زەویەکەی وەکو ڕەنگی دوڕ و یاقوت جوان و درەوشاوە بوو، ئینجا بەوێدا تێپەڕین و بردیان بۆ زەویەکی فراوان کە میوەی زۆر و جۆراوجۆری لێبوو و لە وڵاتانی تر ئەو میوانە نەبوون.

جا وتیان: ئایا تۆ دەمانبەیت بۆ شوێنێک کە لەوە زیاتری لێبێت؟

ذوالقرنین وتی: نەخێر سوێند بەخوا بەشێکی ئەوەشتان بۆ نادۆزمەوە.

ئەوانیش وتیان: هەموو ئەمانە لەژێر دەستی ئێمەن و ئەو میوانە لەگەڵ حەشیش بەکاردێنین، بەڵام ذوالقرنین قەدەغەی کرد لە هاوەڵانی کە دەست بۆ ئەو حەشیش و شتانەی ئەوێ ببەن، وە دوای سەرسام بوونی بەو دیمەنانەی لەو وڵاتە بینی خواحافیزی لەو قەومە کرد و سواری کەشتی بوو و جێی هێشتن"

وەک دەبینین ئەم وەسفانەی کە لەم بەسەرهاتە هاتوون لەگەڵ زەویەکانی ئەمریکا نەبێت لەگەڵ هیچ شوێنی تر ناگونجێت.

بۆ نمونە سەرەتا ذوالقرنین تەنها بەشێکی کەمی دورگەکەی بینی، دواتر ئەو قەومە لەگەڵ خۆیان بردیان و نیشانیاندا کە چەند فراوانە، وە هەندێ

میوەی لێ بووە لە وڵاتی تر بوونی نەبووە، لە کێشوەری ئەمریکاش هەندێ میوەی لێیە لە شوێنی تر نییە وەک ئەو میوەیەی کە ناسراوە بە (میوەی پاوپاو-pawpaw) و هی تریش.

## باسی چوارەم/ گەشتی (ذوالمنار) بۆ زەویەکانی ئەمریکا:

(ئەبرەهە ذوالمنار) یاخود (ئەبرەهام) کوڕی ذوالقرنین بوو و بەناوی حەزرەتی ابراهیم(علیه السلام) ناونرابوو، دوای کۆچی دوایی ذوالقرنین زەوی لەنێوان کوڕەکانی دابەش بوو و (ئەبرەهە) بووە پاشای وڵاتانی (یەمەن) و (هیندستان) و (باشووری ئەفریقا).

ئەم پاشایە لە یەکێک لە گەشتەکانی ڕووی کردۆتە زەریای ئەتڵەسی و بە زەویەکانی ئەمریکا گەیشتووە، وە گەیشتۆتە (سێگۆشەی بەرمۆدە)، ئەمەشیان المسعودي لە (أخبار الزمان) باسی دەکات کە ئەبرەهە ذوالمنار گەیشتۆتە ناوچەیەک لەناو دەریا کە شوێنێکی لێ بووە هەموو شتێکی تێدا نوقم دەبوو، جا بێ گومان ئەو شوێنە (سێگۆشەی بەرمۆدە) بووە کە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی کیشوەری ئەمریکای باکوور، بە پێی گێڕانەوەکانی المسعودی ئەبرەهە لەو شوێنە سێ پەیکەری دانا بۆ ئەوانەی لە داهاتوودا دێنە ئەو شوێنە، پەیکەری یەکەم و دووەم ئاماژەیان دەکرد کە بوەستی و نەیەیتە پێشەوە، وە لەسەر سێیەمیان نوسرابوو: (ئەوەی بێرە بگات نوقم دەبێت)، ئەمەش دەکرێ بە یەکەم هێمای هاتوچۆ دابنرێ لە مێژوودا.

وەک لەسەرەتای ئەم باسەدا ئاماژەمان پێدا (ئەبرەهە ذوالمنار) پاشای خەڵکی یەمەن و هیندستان بووە، جا ئەم پاشایە لە مێژووی هیندستان بە (برەهمن) ناوی هاتووە و دوای ئەوەی کۆچی دوایی کرد بەشێک لە خەڵکی هیندستان پەیکەریان بۆ دروست کردووە و دواتر پەرستوویانە، وە هیندۆسەکانیش تا ئێستا برەهمن دەپەرستن، بەڵام برەهمن یاخود (ئەبرەهە) یەکتاپەرست و ئیماندار بووە و دوورە لەو کردەوانەی ئەوان دەیکەن.

ئەوەی جێی باسی ئێمەیە لێرەدا ئەوەیە کە سەربازەکانی ئەبرەهە ئەوانەی لەگەڵی ڕۆشتوون بۆ ئەمریکا خەڵکی وڵاتانی هیند و یەمەن بوون، جا

بەشێکیان لە زەویەکانی ئەمریکا ماونەتەوە، وە لەسەر کردنی (عەمامە) بەشێک بووە لە کلتوریان و ئەم کلتورەیان گواستۆتەوە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەمریکا تا ئەوەی پۆشینی (عەمامە) بۆتە بەشێک لە کلتوری خەڵکی کۆنی ئەمریکای باکوور، وەک لەم تابلۆیەدا دیارە کە تاکێکی ئەمریکای کۆن نیشاندەدا:

ئەم تابلۆیە لەلایەن وێنەکێشێکی ئەمریکیەوە کێشراوە لە سەدەی نۆزدە

## باسی شەشەم / کۆنترین نشینگە و شارەکانی ئەمریکا:

لەم باسەدا ئەو شارە دێرینانەی زەویەکانی ئەمریکامان خستۆتەڕوو کە مێژوویەکی کۆنیان هەیە و ئاسەواریان ماوە، وە ئاماژەمان بە ساڵ و شوێنی بنیادنانیشیان کردووە، هەرچی ساڵی بنیادنانیانە لێکدانەوە و ڕاوبۆچوونی لێکۆلەرانی ئێستایە، جا مەرج نییە تەواو ڕاست و بێ کێشە بن و دەکرێ کۆنتر یان نوێتر بن لەو ساڵانەی بۆیان دیاری کراوە.

- هەرەمی کەراڵ: بە کۆنترین شوێنی نیشتەجێبوونی خەڵکی کۆنی ئەمریکا دادەنرێ کە ئاسەواری مابێت، دەکەوێتە ناوچەی (نۆرتێ چیکۆ لە وڵاتی پێرۆی ئێستا)، دەوترێ زیاتر لە چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا دروست کراوە، ئەمەش ئاسەواری هەرەمەکەیە:

- شاری کامینالجویو: دەوترێ زیاتر لە سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە، دەکەوێتە وڵاتی (گوانتانامۆ)ی ئێستا.
- شاری چۆلولا: نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەی (پیوبلا) لە وڵاتی (مەکسیک)ی ئێستا.
- شاری کویکویلکۆ: نزیکەی سێ هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە شاری (مەکسێک) لە وڵاتی (مەکسیک).

شاری تیکاڵ: زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەی (یوکاتان) لە (مەکسیک).

- شاری تیۆتیهواکان: نزیکەی ٢٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادناوە و دەکەوێتە (مەکسیک).
- شاری میتلا: دەوروبەری ١٨٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە لە ناوچەی (واکساکا) لە (مەکسیک).
- شاری کوینکا: نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەی (ئازوای) لە وڵاتی (ئیکوادۆری ئێستا).
- شاری ئیجوتلا: نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەی (واکسانا) وڵاتی (مەکسیک).
- شاری ئیزامال: نزیکەی ١٥٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەی (یوکاتان) وڵاتی (مەکسیک).
- شاری کاهۆکیا: دەوروبەری ١٤٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەکەوێتە ناوچەکاننی (ئیلینۆیس) لە (ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا).
- شاری تولا: نزیکەی ١٣٠٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە لە ناوچەی (هیدالگۆ) لە (مەکسیک).

- شاری ئاكۆما پیۆبلا: دەوروبەری هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە ویلایەتی (نیو مەكسیكۆ) لە (ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا).
- شاری مۆتول: دەوروبەری هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە ناوچەی (یۆكوتا) لە (مەكسیک).
- شاری پاچوكا: دەوروبەری هەزار ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە ناوچەی (هیدالگۆ) لە (مەكسیک).
- شاری كوسكۆ: دەوروبەری نۆ سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە (كوسكۆ پرۆڤینس) لە (پێرۆ).
- شاری ئۆرایبی: دەوروبەری نۆ سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە (ویلایەتی ئەریزۆنا) لە (ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا).
- شاری ئیكاتیپیک: نزیكەی نۆ سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە (ئیستادۆ دی مەكسیكۆ) لە (مەكسیک).
- چیمالهواكان: زیاتر لە حەوت سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە ویلایەتی (مەكسیكۆ) لە (مەكسیک).
- خەلەپە: زیاتر لە حەوت سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە لە (مەكسیک).
- تینۆچتیتلان: حەوت سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە لە (مەكسیک).
- ئیتزۆنوا: نزیكەی شەش سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە لە ناوچەی (كانساس) لە (ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا).
- زونی پیۆبلۆ: نزیكەی شەش سەدە پێش ئێستا بنیادنراوە لە ناوچەی (كانساس) لە (ویلایەتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا).
- شاری ئیخیمچی: دەوروبەری ٥٥٠ ساڵ پێش ئێستا بنیادنراوە و دەكەوێتە ناوچەی (چیمالتینانگۆ) لە وڵاتی (گوانتانامۆ)ی ئێستا.

## باسی حەوتەم / کەمی زانیاری دەربارەی زەویەکانی ئەمریکا:

سەرەڕای ئەوەی خەڵکی کۆنی ئەمریکا زۆر بوونە و شارستانیەتی خۆیان هەبووە، بەڵام پەیوەندیان لەگەڵ خەڵکی کیشوەرەکانی تر نەبووە و خەڵکی ئێرەش زانیاری نەبووە بەوەی کە زەویەکی ئەوەندە فراوان لە پشت زەریای ئەتڵەسیەوە هەبێت.

## باسی هەشتەم / گیرسانەوەی هەندێ لە یەهودیەکان لە ئەمریکا:

لە سەدەی یەکی زایینی قەیسەرێکی ڕۆم بەناوی (تیتۆس) شاری (قودس)ی گرت و دەستی بە کوشتن و لەناوبردنی یەهودیەکانی ئەو شارە کرد، بۆیە زۆر لە یەهودیەکان هەڵاتن و بە دونیادا بڵاوبوونەوە.

بەشێکیان چوونە مەغریب و زەویەکانی ڕۆژئاوا، وە بەشێکیشیان بۆ دوورگەی دوور ڕۆشتن، بە پێی وتەی المسعودي تابووتی پێغەمبەر سولەیمانیشیان گواستۆتەوە بۆ دوورگەیەک، جا سەرچاوەکان باس لەوە دەکەن کە بەشێکیان بە کیشوەری ئەمریکا گەیشتوون، بەو بەڵگەیەی لە ئێستادا نووسینێکی هەڵکۆڵراو لە ویلایەتی (ڤیرجینیا) دۆزراوەتەوە کە بە پیتی عیبری(زمانی یەهودی) نوسراوە و لێکدەرەوان مێژووەکەیان گەڕاندەوە بۆ سەدەی یەکەمی زایینی، ئەمەش وێنەی نووسینەکەیە:

## باسی نۆیەم / وتەیەکی حەزرەتی (عوقبە)ی کوڕی (نافع):

عوقبەی کوڕی نافع لە سەردەمی پێغەمبەری خوا(دروودی خوای لەسەر بێ) لەدایک بووە لە ساڵی ٨ی کۆچی، یەکێک بووە لە گەورەترین مجاهدانی مێژوو کە لە سەردەمی خەلافەتی ڕاشدین و دەوڵەتی ئومەوی بەشداری چەندین فتوحاتی کردووە، وە بە (فاتحی ئەفریقا) ناسراوە.

دەگێڕنەوە لە سەردەمی فەتحی ئەفریقا کە سوپای ئیسلام گەیشتە ئەوپەڕی کەنارەکانی مەغریب حەزرەتی عوقبە لەسەر کەنارێکی زەریای ئەتڵەسی وەستا(واتا ڕووەو ئەمریکا) و وتی: (ئەی خودایە ئەگەر دەمزانی زەویەکی تر لە پشت ئەم دەریایە هەیە تا وشەی -لا اله الا الله- م لێ بەرزکردبایەوە).

وەک لەم بەسەرهاتەدا ڕوونە کە موسڵمانان لەسەرەتای بڵاوبوونەوەی ئیسلامەوە پێشبینی ئەوەیان کردووە کە زەویەک لە پشت زەریای ئەتڵەسیەوە هەبێت.

جێی باسە زانا و مێژوونووس ئیمامی شەعبی(رحمه الله) کە لە سەردەمی ئیمامی عومەر(رضي الله عنه) لەدایک بووە و لە عێراق نیشتەجێ بووە بەو زانیاریە گەیشتبوو کە کیشوەرێک لە پشت زەریای ئەتڵەسیەوە هەیە و خەڵکیشی لێ دەژی، لە بارەیەوە دەفەرموێ: خەڵکێک بوونیان هەیە لە پشت ئەندەلوس(ئیسپانیای ئێستا)، ئێمە و ئەندەلوس چەند لە یەک دوورین ئەو خەڵکەش ئەوەندە لە ئەندەلوس دوورن.

جا ئەگەر پێوانەکان بخەینە ڕوو بە پێی نەخشەکانی ئێستا دەبینین عێراق و ئەندەلوس نزیکەی (٤٧٠٠) کیلۆمەتریان لە نێوان هەیە، هەرچی ئەندەلوس و ئەمریکایە نێوانیان بە نزیکەیی (٥٧٠٠) کیلۆمەترە.

## باسی دەیەم/ گەشتی (خەشخاشی کوڕی سەعید) بۆ ئەمریکا:

لە ساڵی ٢٧٥ی کۆچی(٨٨٩ی زایینی) کۆمەڵێک کەشتیوان لە ئەندەلوس(ئیسپانیای ئێستا) گەشتێکیان بەرەو زەریای ئەتڵەسی کرد و گەشتنە زەویەکی زۆر فراوان لە پشت ئەو زەریایەوە کە خەڵکیشی لێ دەژیا، وە لەو کاتەی گەڕانەوە هەندێ لە دراو و زیو و کەلوپەلی بە نرخی ئەو وڵاتەشیان هێنابوویەوە.

یەکێک لە کەشتیوانەکان کە لەم گەشتە بەشداربووە ناوی (خەشخاش کوڕی سەعید کوڕی ئەسوەد) بووە و بەسەرهاتەکەی گێڕاوەتەوە کە لەوێ گەیشتنە خەڵکێک، جا بە وردی وەسفی جلوبەرگ و خواردن و شێوازی ژیانی ئەو خەڵکەی کردووە.

ئەم بەسەرهاتەش لە کتێبی (مروج الذهب) هاتووە و لەلایەن (المسعودي) لە خەشخاشەوە گێڕدراوتەوە.

ئیتر لەو سەردەمەوە خەڵکی ئەندەلوس لەوە دڵنیا بوونەوە کە زەویەکی فراوان لە پشت زەریای ئەتڵەسیەوە هەیە و چەندین جاری تر گەشتیان بۆ کردووە، وە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیشیان بە خەڵکەکەی ئاشنا کردووە و بەشێک لە خەڵکەکەی(بە تایبەت ناوچەی کۆلۆمبیای ئێستا) موسڵمان بوونە.

شایەنی باسە کە زەریای ئەتڵەسی لە سەرچاوە کۆنەکان بە (بحر الظلمات) ناوی هاتووە.

## باسی یازدەیەم/ ئەمریکا لە نوسراوەکانی ئیدریسی:

لە کۆنترین نەخشەی گشتگیری جیهان کە لەلایەن (محمد الادریسي) نزیکەی هەزار ساڵ پێش ئێستا کێشراوە ئاماژە بە زەویەک دراوە لە پشت زەریای ئەتڵەسی و بە أرض الكبير(واتە: زەویە گەورەکە) ناوی هاتووە.

ئیدریسی لە کتێبی (المسالک والممالک) باس لەوە دەکا کە کۆمەڵە گەڕیدەیەک لە (لیشبۆنە)ەوە بەرەو بەحری ظلمات(زەریای ئەتڵەسی) گەشتیان کرد تا گەیشتنە ئەو زەویە فراوانە، کاتێکیش گەڕانەوە بۆ خەڵکیان باسکرد کە لەوێ گەیشتنە خەڵکێک زمانی عەرەبیان دەزانی.

ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە گەشتەکەیان بۆ کۆلۆمبیا یان باکووری بەرازیلی ئێستا بووە، چونکە لەو سەردەمە موسڵمانان لەوێ بوونیان هەبووە.

بەپێی لێکدانەوەکان شێخی بەربەرەکان (یاسین جزولی) باوکی (عبدالله بن یاسین)ی دامەزرێنەری دەوڵەتی (مورابیتین) ئیسلامی لەناو خەڵکی ئەوێ بڵاوکردۆتەوە.

## باسی دوازدەیەم/ گەشتی گەڕیدەیەکی ئیسکەندەنافی بۆ ئەمریکا:

دەوروبەری ساڵی ١٠٠٠ی زایینی گەڕیدەیەکی نەرویجی ئیسکەندەنافی بە ناوی (لیف ئێریکسن) گەشتی کردووە بۆ بەستەڵەکی باکوور و لەوێشەوە بە کەنەدای ئێستا گەیشتووە.

ئێریکسن کوڕی (ئیریک ذە رێد)ە کە بت پەرستێک بوو و دواتر بووە نەسڕانی، نەتەوەکەی لە کتێبە مێژووییەکان بە (ڤایکینگ) ناویان دێ، وە گەڕیدەی عەبباسی (ابن فضلان) گەشتی بۆ ناو ئەو نەتەوەیە کردووە و باس لەوە دەکا کە یەکێک لە عادەتەکانی ئەو بتپەرستانە ئەوەبوو کاتێک پیاوێکیان لێ دەمرد ژنەکەشیان لەگەڵ دەناشت.

ئەوەی گرنگە لێرەدا باسی بکەین ئەوەیە کە ئێریکسن کاتێک گەیشتە باکووری ئەمریکا خانوویەک و شوێنێکی نیشتەجێ بوونی لێ دروستکرد کە ئێستا شوێنەواری ماوە.

## باسی سێزدەیەم/ ئەو کەشتیانەی بە فەرمانی (مانسا موسا) گەشتیان کرد بۆ ئەمریکا:

مانسا موسا نزیکەی حەوت سەدە پێش ئێستا ژیاوە کە پاشای وڵاتی مالی بوو لە ئەفریقا و بە دەوڵەمەندترین کەسی سەردەمی خۆی دادەندێ کە سامانەکەی بە دراوی ئێستا دەکاتە ٤٠٠ ملیار دۆلار.

دەگێرنەوە لەو کاتەی چوو بۆ حەجی ماڵی خوا بە هەر شارێک تێپەڕیبا هەژاریی لێ بنبڕ دەکرد.

مانسا موسا فەرمانیدا کە دووسەد کەشتی بە زەریای ئەتڵەسیدا بگەڕێن بۆ دۆزینەوەی زەویە گەورەکە و لە هەواڵی خەڵکی ئەوێ دڵنیا ببنەوە، جا دوای گەیشتنیان بە کیشوەری ئەمریکا تەنها یەک کەشتیان گەڕایەوە ئەفریقا و ئەوانەی تر لە ئەمریکا مانەوە چونکە خەڵکی ئەمریکا پێویستیان بە یارمەتی ئەوان بوو لە چەندین بابەت، لەوانە: بۆ بابەتی شارەزاکردنیان لە ئیسلام لەناویان مانەوە، وە فێریان کردن کە چۆن زێڕ دروست بکەن.

خاچپەرستانی سەدەی شازدەی زایینیش باسیان لەوە کردووە کە کاتێک کیشوەری ئەمریکایان دۆزیەوە بینیان ئەو زێڕەی خەڵکی ئەمریکا هەیانبوو هەمان شێوازی زێڕی ئەفریقی هەیە لە ڕووی دروستکردنەوە.

بەسەرهاتی ئەم گەشتەی سەردەمی مانسا موسا لەلایەن مێژوونووسی ناودار (شهاب الدين العمري) گێڕدراوەتەوە لە کتێبی (مسالک الأبصار في ممالك الأمصار).

## باسی چواردەیەم/ گەشتی (چێنگ خە) بۆ ئەمریکا:

چێنگ خە لە خێزانێکی موسڵمان لە باشوری وڵاتی چین لە ساڵی (١٣٧١)ی زایینی لە دایک بووە، گەورەترین کوڕی خێزانەکەیان بوو و چوار خوشکی لە خۆی بچوکتری هەبوو، چێنگ خە نازناوی (شمس الدین) بوو، لە سەردەمی خاقانیەتی (مینگ) ژیاوە، زۆر حەزی بە کاری دەریاوانی دەکرد و لە سوپای ئەوکاتی (چین) سەرکردایەتی کەشتیگەلی پێ ڕاسپێردرا بوو.

چێنگ خە چەند گەشتێکی درێژ مەودای ئەنجام داوە لە نێوان ساڵانی (١٤٠٥) تا کۆچی دوایی لە ساڵی (١٤٣٣)ی زایینی.

بە هەموو زەریای هیندیدا گەڕاوە و دواتر ڕووی کردۆتە شاری مەککە بۆ ئەنجامدانی فەریزەی حەج، دوای ئەنجامدانی حەج بە (حاجی شمس الدین) ناسرا.

دواتر گەشتی کرد بۆ باشووری ئەفریقا و دەریاکەنی ئەوێشی بڕی تا گەیشتە ڕۆژئاوا و باکووری ئەفریقا و لەوێشەوە گەیشتە ئەندەلوس، جا خەڵکی ئەندەلوس کە زانیان کەسێکە زۆر حەز بە گەڕان دەکا بەناو دونیادا زانیاریان پێدا دەربارەی کیشوەری ئەمریکا و بۆیان ڕوونکردەوە کە چۆن بگات بەو زەوییە.

چێنگ خە دەستی بە بڕینی دەریا و زەریاکان کرد تا لە ساڵی (١٤٢١)ی زایینی گەیشتە ئەمریکای باشوور، دواتریش گەڕایەوە بۆ ئەندەلوس و ئینجا گەڕایەوە بۆ وڵاتەکەی، لە وڵاتەکەی نەخشەی جیهانی دروستکرد بە کیشوەری ئەمریکاشەوە، وە لەبەرگیراوەیەکی نەخشەکە لە ئێستادا ماوە کە لە سەدەی هەژدە لە چین دروستکراوەتەوە.

# پێرست